


# پوختەیەک باسی لە دایکبوونی

## باشترین درووستکراو پێغەمبەری خوا ﷺ



شەرحی مامۆستا مەبەست کاژاوی

سوود بینراوە لە کتێبی

مختصر سيرة النبي ﷺ وسيرة أصحابه العشرة

لە دانانی

أبي محمد عبدالغني بن عبدالواحد المقدسي



بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على إمام المرسلين نبينا محمد وعلىٰ آله وصحبه أجمعين ،

اللهم أرنا الحق وارزقنا اتباعه،وأرنا الباطل باطلا وارزقنا اجتنابه أما بعد......



## ڕەچەڵەکی پێغەمبەری خوا ﷺ

ڕەچەڵەکی پێغەمبەری خوا ﷺ بریتیە لە : ﴿ (أبو القا سم ) مُحَمَّدُ بنُ عبدِ اللهِ بنُ عبد المطلِب ابنُ ها شم بنُ عبدِ مَنَاف بنُ قُصَي بنُ كلاب بنُ مُرَّة بنُ كَعْبِ ابنُ لؤَيِّ بن غالب بن فهْر بن مالك بن النَّضْر بن كنانَة بن خُزَيمَةَ بن مُدْركَةَ بن إلياس بن مُضرَ بن نِزار بن معَدِّ بن عَدْنان﴾.

ئیتفاقی زانایانی سیرە لەسەر ئەوەیە هەتا عەدنان هیچ خیلافێک نیە کە پێغەمبەری خواﷺ ڕەچەڵەکەکەی دەگەڕێتەوە بۆ عەدنان، وە عەدنانیش

له نەوەکانی پێغەمبەر ئیسماعیله ﷺ،له پاشان ئیمام عبدالغني ﵀ دەفەرموويت:

{عَدْنان بن أُددَ بن ال مُقَوم بن ناحور بن تَيْرَح بن يَعْرُبَ بن يَشْجُبَ بن نابت بن إسماعيل بن إبراهيم (خليل الرحمن) بن تَارح (وهو آزَرُ) بن ناحور بن ساروع بن راعو بن فَالخ بن عَيْبر بن شَالَخ بن أَرْفَخْشَدَ بن سَام بن نُوح بن لمك بن مُتوشَلَخُ بن أخنوخ - وهو إدريس النبي فيما يزعمون}

پێغەمبەری خوا ﷺ دەگاتەوە سەر پێغەمبەر ئیدریس ﷺ ، كه یەكەم كەس بووە پێغەمبەرایەتی پێ دراوە ، وە یەكەم كەس بووە كه توانای هەبوو بنوسێت.

پاشان ئیمام ﵀ دەفەرموويت : {ابن يَرْدَ بن مَهليل بن قينن بن يـانَش بن شيث بن آدَمَ ﷺ}

دەفەرموويت: ئا ئەمە ڕەچەڵەكی پێغەمبەری خوا ﷺ ، تا دەگاتەوە پێغەمبەر ئادەم ﷺ ، وە دەفەرموويت: هەتا عەدنان هیچ خیلافێك نیە لە نێوان زانایان ، بەڵام دوای عەدنان ئیختیلاف هەیە لەو ڕەچەڵەكەیدا ، وە گومانی تێدا نیە كه عەدنان لە نەوەكانی پێغەمبەر ئیسماعیله ﷺ ، وە ئیسماعیلیش كوڕی پێغەمبەر ئیبراهیمە ﷺ .

زانایان ڕەحمەتی خوایان لێ بێت دەفەرموون: ئەو ڕەچەڵەكەی لە دوای عەدنانەوە دانراوە زۆرینەی لە كتێبەكانی ئەهلی كتابەوە دەرهێنراوە.

وە زۆرینەی لە تەورات و ئینجل دەرهێنراوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ڕاگەیاندوین و فەرموویەتی: ﴿ **ئەوەی لە ئەهلی کیتابەوە هات نە بەراستی بزانن و نە بەدرۆی بخەنەوە** ﴾ چونکە ئێمە نازانین کامە ڕاستەکەیە و کامە درۆینەکەیەتی.

پاشان ئیمام ﷀ دەفەرموویت: قورەیش لە نەوەکانی فهری کوڕی مالکە ، هەندێکی تریش دەفەرموون : لە نەوەکانی نضری کوڕی کینانەیە ، وە ڕای درووستیش ئەوەیە کە قورەیش لە نەوەکانی نضری کوڕی کینانەیە ، وەک ئیمام ئەحمەدیش ﷀ لە موسنەدەکەی هێناوییەتی بەسەنەدێکی حەسەن فەرموودەیەکمان بۆ نەقڵ دەکات دەفەرموویت:

﴿عن الأشعث بن قيس الكندري قال: قدمت على رسول الله ﷺ في وفد كندة فقلت: ألستم منا يا رسول الله ؟ فقال: لا نحن بنوا النضر بن كنانة لا نقفوا أمنا ولا ننتقي من أبينا ﴾

واتە: کەسێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە وەفدی کندە ، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێوە لە ئێمەن واتە هەمان قەبیلەن ، فەرمووی: نەخێر ئێمە لە نەوەی نضری کوڕی کینانەین کە قوڕەیش دەکات.وە کونیەکەی پێغەمبەر ﷺ بریتیە لە: **(أبو القاسم)**

## ڕەچەڵەکی دایکی پێغەمبەر ﷺ

پاشان ئیمام ﷺ دەفەرموویت: ﴿ آمِنةُ بنتُ وَهْبٍ بن عبد مَناف بنِ زُهرَةَ بنِ كلاب بنِ مُرَّة بن كَعْبِ بنِ لُؤيٍّ بنِ غالب. ﴾

واتە: دایکی پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی ئامینەی کچی وەهبی کوڕی عبد مناف کوڕی زهرة کوڕی کلاب کوڕی مرة کوڕی کعب کوڕی لؤی کوڕی غالب.(لە غالبدا دەگەڕێتەوە بۆ ڕەچەڵەکی باوکی پێغەمبەری خوا ﷺ).



## لە دایکبوونی پێغەمبەری خوا ﷺ

پاشان ئیمام رحمه الله دەفەرموویت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دایک بووە لە مەککە لە ساڵی فیل ئەو ساڵەی کە ئەبرەها و کافرەکان ویستیان فیلەکانیان بهێنن کەعبە بروخێنن ، بەڵام خوای گەورە خۆی خاوەنی کەعبە بوو لە ناوی بردن کەعبەی پاراست لە دەست ئەو بێ بڕوایانە ، وە ئیمام رحمه الله دەفەرموویت : پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ساڵەدا لە دایک بووە ، لە مانگی

ربيع الأول كە دوو ڕۆژ تێپەڕی کردبوو لەو مانگە ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی دووشەممەدا لە دایک بوو ، هیچ خیلافێک نیە لە نێوان زانایان کە لە ڕۆژی دوو شەممە لە دایک بووە ، چونکە کاتێک پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژانی دوو شەممە بەڕۆژوو دەبوو پرسیاریان لێ کرد بۆچی لەم ڕۆژەدا بەڕۆژوو دەبی فەرمووی: **(ڕۆژێکە کە تێیدا لە دایک بووم)** ، لە بارەی ئەوەی کە چەندی مانگ پێغەمبەر ﷺ لە دایک بووە خیلافێکی زۆر هەیە لە نێوان زانایان ، لێرەدا ئیمام عبدالغني رحمه الله دەفەرموویت: لە دووی ربيع الأول لە دایک بووە ، بەڵام هەندێک لە ئەهلی عیلم فەرموویانە: لە دوانزەی ربيع الأول لە دایک بووە ، هەندێک تر لە زانایان دەفەرموون: لە نۆی ربيع الأول لە دایک بووە ، هەندێکی کە دەفەرموون : لە مانگی ربيع الأول لە دایک نەبووە ، بەڵکو لە مانگی ڕەمەزاندا لە دایک بووە ، دەربارەی مانگەکە زۆربەی زانایان پێیان وایە کە لە مانگی ربيع الأول لە دایک بووە ، بەڵام چەندی مانگ بووە ئەوە خیلاف هەیە لە نێوان زانایان ، هەندێک لە زانایان دەفەرموون: نۆی ربيع الأول کە ڕاسترینیانە ، خیلاف هەیە لە نێوان ئەهلی عیلمدا هەتا ئێستا کە چەندی مانگ لە دایک بووە ، ئەمەیش حیکمەتێکی تێدایە بۆ ڕەدی ئەوانەی کە بیدعەیەکیان داهێناوە بەناوی یادی لە دایکبوونی پێغەمبەری خوا ﷺ ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە هیچ شێوەیەک ئەمری بەوە نەکردووە ، وە ساحابەکانیش هیچ یەکێکیان یادی لە دایکبوونی پێغەمبەری خوایان ﷺ

نەكردووە ، نە ئەبو حەنیفە ، نە مالیک ، نە ئەحمەد ، نە شافعی ، نە ئەوزاعی ، نە سفیانی ثوری هیچ یەكێک لەوانە ڕەحمەتی خوای گەورەیان لێبێت یادی لە دایک بوونی پێغەمبەریان ﷺ نەكردووە ، بەڵكو ئەمە لە سەدەی چواری هیجریدا فاتیمە شیعەكان لە میسر بە ناوی خۆشەویستیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دایان هێنا ، وتیان: چۆن دەبێ گاورەكان یادی لە دایک بوونی عیسا بكەن بۆچی ئێمەیش یادی لە دایک بوونی پێغەمبەری خوا ﷺ نەكەین خۆیان شوبهان بە گاورەكان ، لە كاتێكدا پێغەمبەر عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ بە هیچ شێوەیەک ئەمری نەكردووە بۆ ئەوەی یادی لە دایک بوونی بۆ بكرێت ، لە دینی ئەوانیشدا داهێنراو بوو ، هەر بۆیە زانایان دەفەرموون: حیكمەت لەوەدایە كە هەتا ئێستا خیلاف هەیە لە نێوان زانایان نازانرێ بە دەقیقی چەندی مانگ پێغەمبەری خوا ﷺ لە دایک بووە كە ئەمەیش حیكمەتێكی تێدایە بۆ ڕەدی ئەوانەی كە یادی لە دایک بوونی پێغەمبەر ﷺ دەكەن.

خوای گەورە لە سورەتی[ ال عمران ]دەفەرمووێ:﴿قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ ٣١﴾

خوای گەورە دەفەرموویت:ئەی محمد پێیان بڵێ:ئەگەر ئێوە خوای گەورەتان بەراستی خۆشدەوێ ئەوا شوێن من بكەون{**خۆشویستنی خوای گەورە بەستراوە بە شوێن كەوتنی پێغەمبەر ﷺ**}.

## لە شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ مرۆڤی موسڵمان دوو شتی دەست دەکەوێت ،

**یەکەم:** خوای گەورە دەفەرموویت: ئەگەر شوێن پێغەمبەری خوا ﷺ بکەون خوای گەورە ئێوەی خۆش دەوێ ، کەواتە گەورەترین بەرهەمی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەیە کە خۆشویستنی خوای گەورەمان دەست دەکەوێت.

**دووەم:** ئەوەی کە دەستمان دەکەوێت ، ئەوەیە خوای گەورە لە هەموو تاوانەکانمان خۆش دەبێ ، وەک لە چەندین فەرموودەی شیرینی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە ، لە یەکێک لە فەرموودەکاندا دەفەرموویت:

**﴿ خوای گەورە دەفەرموویت :ئەی بەندەکەم ئەگەر بە هەرچی تاوانەوەیە بگەڕیتەوە بۆ لای من وە شەریکت بۆ دانەنابێتم ئەوە بێگومان لە پاڵیشیدا شوێن پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتبێتی (بێگومان تەوحید و سونەتیشت هەبوو بێت) ئەوا من لە هەموو تاوانەکانت خۆش دەبم﴾ .**

پاشان ئیمام رحمه الله دەفەرموویت:هەندێک لە ئەهلی عیلم فەرموویانە: لە دوای ساڵی فیل بە سی ساڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە دایک بووە ، واتا سی ساڵ لە دوای ساڵی فیل پێغەمبەر ﷺ لە دایک بووە ، وە هەندێکی تر فەرموویانە: بە چل ساڵ ، بەڵام راسترینیان ئەوەیە لە ساڵی فیل لە دایک بووە لە ڕۆژی دووشەممەدا ، بەڵام چەندی مانگە ئەویش وتمان خیلاف

هەیە لە نێوان ئەهلی عیلمدا هەندێک دەفەرموون: نۆی رَبِيعُ الأَوَّل ، وەک ئیمام رَحِمَهُ الله لەم کتێبەدا دەفەرموویت: دووی رَبِيعُ الأَوَّل ، هەندێکی تر دەفەرموون: دوانزەی رَبِيعُ الأَوَّل کە زۆرینەیان وا دەفەرموون ، هەندێکیان دەفەرموون: لە مانگی رەمەزاندا بووە ، بەڵام نزیکترین بۆچوون لە سەحیحەوە ئەوەیە کە نۆی رَبِيعُ الأَوَّل پێغەمبەری خوا ﷺ لە دایک بووە ،ئەوە راسترینیانە والله أعلم هەرچەندە خیلاف هەیە لە نێوان زانایان رەحمەتی خوای گەورەیان لێ بێت.



## وەفاتی باوکی پێغەمبەری خوا ﷺ

زانایان رەحمەتی خوای گەورەیان لێبێت دەفەرموون: کاتێک کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە دایک بوو باوکی وەفاتی کرد ،کاتێ پێغەمبەر ﷺ تەمەنی بیست و هەشت مانگ بوو ، هەندێک دەفەرموون: حەڤدە مانگ بوو ، هەندێکی تر دەفەرموون: پێغەمبەر ﷺ لە ناو سکی دایکیدا بوو ، کاتێک باوکی وەفاتی کرد ، کە ئەوەیش قەولی سەحیحە کە ئەویش یەک دەگرێتەوە لەسەر کەمالی یەتیمێت.

ئەوەی کە خوای گەورە منەتی بەسەردا دەکات کاتێک دەفەرموویت:

﴿أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَـآوَى ۝٦﴾

واتە :کاتێک هەتیو بوویت ، ئێمە یارمەتیمان دایت ، ئێمە پاڵ پشتیمان کردی ، کە بێ گومان هەتیووی حەقیقی ئەو کەسە کە لە ناو سکی دایکی خۆیەتی و باوکی وەفات دەکات ، پێغەمبەر ﷺ لە ناو سکی دایکیدایە و باوکی وەفات دەکات ، زانایان رەحمەتی خوای گەورەیان لێبێت دەفەرموون: کاتێک کە باوکی وەفات دەکات باوکی تەمەنی بیست و پێنج ساڵ دەبێ لە **(دار و النابغة)** شوێنێکە لە مەدینە لەوێ وەفاتی کردووە والله أعلم ، لە دوای ئەوەی کە باوکی وەفات دەکات پێغەمبەر ﷺ لە دایک دەبێ.



## کۆمەڵێک نیشانە کە زانایان رەحمەتی خوای گەورەیان لێبێت باسی دەکەن لە کاتی لەدایک بوونی پێغەمبەری خوا ﷺ روویداوە ،

**یەکەمیان:** دەفەرموون: **{ئەوەیە کە نورێک لە دایکیەوە دەرچوو قەسرەکانی شام رووناک بووە بە هۆی ئەو نورەوە}**

وەکو لە چەندین فەرموودەدا پێغەمبەر ﷺ باسی کردووە دەفەرمویت: {

أنَّه خرَج منها نورٌ أضاءَتْ لها منه قصور الشام} كە بێ گومان ئەمە فەرمودەیەکی سەحیحە و هیچ گومانێکی تێدا نیە .

**وە نیشانەیەکی تر لە نیشانەکان:** کاتێک پێغەمبەر ﷺ لە دایک بوو ، ئەستێرەیەک دەرکەوت ، کە ئەو ئەستێرەیە زانایانی یەهودی و نەسرانی دەیان زانی کە دەرکەوتنی ئەو ئەستێرەیە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی هاتنی کوتا پێغەمبەر ﷺ ، بۆیە کە کاتێک ئەستێرەکە دەرکەوت وتیان: ئیلا شتێک رویداوە کە پێغەمبەری ئاخری زەمان لە دایک بووە. وە دوای ئەوە ئەهلی عیلم دەفەرموون:

**هەندێک نیشانەمان هەیە مشهورە لە ناو خەڵکیدا** ، بەڵام هەر هەموویان فەرموودەکەیان لاوازە و سەحیح نیە ، لەو نیشانانە کە باسی دەکەن دەڵێن: کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە دایک بوو قەسرەکەی کیسرا ئەلەریەوە کە بێ گومان ئەمە سەحیح نیە.

**یان دەڵێن:** کاتێ کە پێغەمبەر ﷺ لە دایك بوو ئاگردانی مەجوسیکان کوژایەوە کە بێ گومان ئەمانە هیچ بەڵگەیەکی سەحیحی لەسەر نەهاتووە.



## ئایە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە دایک بوو بە خەتەنەکراوی لە دایک بوو ، یان وەك هەموو منداڵێکی تر خەتەنەکرا.

هەندێک لە ئەهلی عیلم حەدیسێکی لاواز بەڵگایەنە کە دەڵێن :

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿**لە کەرامەتی خوای گەورە بۆ من ئەوەیە لە دایک بووم بەخەتەنەکراوی وە هیچ کەسێک عورەتی منی نەبینیوە**﴾ ، بەڵام ئەهلی عیلم دەفەرموون: ئەمە فەرموودەیکی لاوازە ، بەڵام سەحیح ئەوەیە عبد المطلب کە باپیری پێغەمبەری خوایە ﷺ لە حەوتەم ڕۆژی لە دایک بوونیدا خەتەنەیکرد، عادەتی عەرەب وابووە کە منداڵەکانیان خەتەنەدەکرد لە ڕۆژی حەوتەمدا ،وە پێغەمبەری خوایش ﷺ لە ڕۆژی حەوتەمیدا خەتەنەکراوە وەک هەموو منداڵێکی تر ، کە واتە ئەوە لاوازە کە بووترێت پێغەمبەری خوا ﷺ بەخەتەنەکراوی لە دایک بووە .

وە لە ڕۆژی حەوتەمیدا کاتێک کە لە دایک بوو پێغەمبەری خوا ﷺ عبد المطلبی باپیری وەك عادەتی عەرەب لە کۆندا حەیوانی بۆ سەربڕی ، وە چێشت و نانی درووست کرد بۆ خەڵک ، وە ئەمە بووە سونەتێک لە دینی ئیسلامیشدا ، کاتێک کە پێغەمبەر ﷺ لە دایک بوو ، باوکی وەفاتی کردبوو هەندێک دەفەرموون: باوکی لە لأبواء شوێنێکە لە نێوان مەککە و مەدینە لەوێ وەفاتی کرد.

{قالَ أبُو عبد الله الزُّبير بن بَكَّار الزُّبيري : تُوفِّي عبدُ الله بنُ عبد المطلب بالمدينةِ ورسول الله ﷺ ابنُ شهرين}.

ئەم زانا بەرێزە ﵀ دەفەرموویت: عبدالله کوڕی عبدالمطلب کە باوکی پێغەمبەری خوایە ﷺ لە مەدینە وەفاتی کرد ، کە پێغەمبەر ﷺ تەمەنی دوو مانگ بوو ، بەڵام وتمان قەولی راست ئەوەیە لەوانە ئیمامی ابن القیم ، ئیمامی زەهەبی ، ابن کثیر رەحمەتی خوایان لێبێت باسی ئەوە دەکەن، کاتێک کە پێغەمبەر ﷺ باوکی وەفاتی کرد ، پێغەمبەر ﷺ لە سکی دایکیدا بوو.



## وەفاتی دایکی پێغەمبەری خوا ﷺ

پاشان ئیمام ﵀ دەفەرموویت: دایکی پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد ، کە پێغەمبەر ﷺ تەمەنی چوار ساڵان بوو ، وە هەندێک دەفەرموون: کاتێک دایکی وەفاتی کرد تەمەنی شەش ساڵان بوو ، کە ئەمەیش رائی راست و دروستە.

## وەفاتی باپیری پێغەمبەری خوا ﷺ

پاشان ئیمام رحمه الله دەفەرموویت: باپیری پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد، تەمەنی پێغەمبەر ﷺ هەشت ساڵان بوو ، لە چەندین فەرموودەدا هاتووە کاتێک پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ تەمەنت چەند ساڵان بوو کە باپیرت وەفاتی کرد؟ ﴿أن النبيﷺ سئل: أتذكر موت عبدالمطلب ؟ قال: نعم ، أنا يومئذ ابن ثماني سنين﴾

وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مردنی عبد المطلبت لە بیرە فەرمووی: بەڵێ: من ئەو ڕۆژە هەشت ساڵان بووم کە باپیرەم وەفاتی کرد.

﴿ قالت: أم أيمن : رأيت رسو الله ﷺ يومئذ يبكي خلف سرير عبدالمطلب ﴾

ئوم أيمەن دەفەرموویت: ئەو ڕۆژە سەیری پێغەمبەری خوام ﷺ دەکرد کە هەشت ساڵان بوو ، ئەگریا لە پەنای جێگاکەی عبد المطلب کە وەفاتی کردبوو ، بێگومان حەق بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ بگری لەو کاتەی کە باپیری وەفاتی کرد، چونکە عبد المطلب کە سێک بوو کە پێغەمبەری خوای ﷺ لە خۆیگرد ، بە خێوی کرد ، وە زۆر خۆشیدەویست ، نزیکی دەکردەوە لە خۆی ، بۆ هەر شوێنێک بڕۆشتایە پێغەمبەری خوای ﷺ لەگەڵدا بوو، بێگومان باپیرەیشی بە کافری وەفاتی کردووە.

## شیرپیدانی
## پێغەمبەری خوا ﷺ

لە پاشان ئیمام رحمه الله دەفەرموویت: یەکەم کەس کە شیری بە پێغەمبەری خوا ﷺ دابێ دایکی خۆی بووە ، سێ دانە ڕۆژ شیری پێداوە ، بەڵام لە دوای سێیەم ڕۆژ ثوێبە کە جارییەی ابی لهب بووە شیر ئەدا بە پێغەمبەر ﷺ و لەگەڵ پێغەمبەریشدا ﷺ حەمزەی مامی کە هاوتەمەنی پێغەمبەر ﷺ بوو ، ئەویش لە شیری ثوێبە دەخوات، وە أبی سلمەی مخزومی کە (عبد اللّٰه بن عبد الأسد المخزومي)ئەویش لە شیری ثوێبە دەخوات، هەر هەموویان شیری ثوێبە دەخۆن لە شیری کوڕەکەی کە ناوی مسروح بووە، کەواتە یەکەم کەس کە پێغەمبەر ﷺ لە دوای دایکی شیری خواردبێ ، شیری ثوێبە بووە ، وە حەمزەی مامی برای شیری پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات ، هەر وەک لە فەرموودەیەکدا کە ئیمامی بخاری و مسلم

ڕوایەتی دەکەن دەفەرموون: ﴿ **پرسیاریان کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ وتیان: ئەی پێغەمبەر ﷺ بۆچی کچەکەی حمزە ناهێنیت کە ئامۆزات دەکات ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە حەڵاڵ نیە بۆ من فەرمووی: ئەوە کچی برامە بە شیری ، ئەوەی کە لە شیر لێت حەرامە وەک چۆن لە نەسەب لێت حەرامە** ﴾

کەواتە ئەوانەی کە شیرییان داوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەم ئافرەت دایکی بووە ، لە دوای دایکی ثوییە بووە ، لە پاش ثوییە ، ئیمام ﵀ دەفەرموویت: ئافرەتێکی دیکە لە دوای ثوییە بە ناوی حەلیمە کچی أبی ذؤیبی سەعدییە شیر دەدات بە پێغەمبەری خوا ﷺ .

لە ناو عەرەب عادەت وابووە کاتێک کە منداڵەکانیان لە دایک دەبوو منداڵەکانیان دەنارد بۆ لادێکان ، ئەوانەی کە لە لادێکان بوون ئەهاتن بۆ شارەکان منداڵی شار نیشنەکانیان دەبرد بۆ لادێکانیان ، تاوەک شیرییان پێ بدەن وە پارەیشیان لەبەرامبەری وەردەگرت ، وە منداڵەکانیان بۆ بە خێو دەکرد و گەورەیان دەکرد ، لەوێ زمانێکی فەسیح فێر دەبوون.

یەکێک لەو قەبیلانەی کە دەهاتن بۆ مەککە ، دێن بۆ لای دایکی پێغەمبەری خوا ﷺ کە منداڵەکەی بەرن شیری پێبدەن، وەک باس دەکەن ئەهلی عیلم خەڵکانێکی زۆر دێن بۆ مەککە دەفەرموون: هەرچی ئافرەتی شیردەرە کە پێغەمبەری خوایان ﷺ بۆ عەرز دەکەن بۆ ئەوەی بیگرنە خۆیان و شیری بەنێ ، بەڵام کەسییان هەڵی ناگرنەوە لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەتیوو بووە ، بەڵام حەلیمەی سەعیدە کە کەسیان بۆ نامێنێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵدەگرن و دەیبەنەوە بۆ لادێکەی خۆیان ، وە کۆمەڵێک موعجیزات لەو ڕێگایەدا روودەدات ، بۆیان دەردەکەوێ کە ئەمە بەرەکەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ ،وەک باسی دەکەن ئەهلی سیرە حەلیمەی سەعدییە مەمکەکانی پڕ دەبن لە شیر ، وە پێغەمبەری خوا ﷺ تێر دەخوات،

پاشان منداڵەکانی تریشی تێر شیر دەخۆن ،وە دوای ئەوە بەرەکەت دەکەوێتە ناو ڕزقیانەوە ، بۆیە مێردی حەلیمە سەعدییە دەڵێ: ئەم منداڵە بەرەکەتێکی زۆر گەورەی پێوەیە،

وە زانایان ڕەحمەتی خوایان لێ بێت دەفەرموون: لەو کاتەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لای حەلیمە سەعدییە دەبێ چەندین موعجیزەی گەورە ڕوو دەدەن.




**یەکێک** لەو موعجیزانە : موعجیزەی سینگ شەقکبوونی پێغەمبەری خوایە ﷺ ، هەروەک ئیمامی موسلم ڕەحمەتی خوای گەورەی لێ بێت لە سەحیحەکەی بە ژمارە (٢٦١) ڕیووایەتی دەکات و دەفەرمویت:{لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رضي الله عنه دەفەرموویت: جبریل عليه السلام هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کە تەمەنی چوار ساڵان بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ منداڵەکاندا یاری دەکرد ، جبریل عليه السلام پێغەمبەری خوای گرت ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ بوورایەوە ، جبریل عليه السلام سینگی شەق کرد ، دڵی دەرهێنا دەفەرموویت: شتێکی دەرهێنا لە ناو دڵی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئا ئەمە بەشی شەیتانە لە ناو دڵی تۆدا دەفەرموویت: پاشان دڵی پێغەمبەری خوای ﷺ شۆرد لە ناو تەشتێکدا بە

ئاوی زەمزەم ، پاشان سینگی پێغەمبەری خوای ﷺ دووریيەوە ، پاشان بردييەوە شوێنەکەی خۆی ، دەفەرمووێت : منداڵەکان هەموويیان لە ترسا گەرانەوە بۆ لای دایکیان وتیان: محمد کوژرا ، پیاوێکمان بینی کە سینگی محمدی شەق کردوو و محمدی کوشت ، چوون بۆ لای پێغەمبەر ﷺ سەیریان کرد دەم چاوی گۆڕاوە ، ئەنەسی کوڕی مالیک دەفەرموویت: من جێگای دوورینەوەکەم بینی لەسەر سینگی پێغەمبەری خوا ﷺ ﴾ .

بێگومان ئەمە موعجیزەی پێغەمبەری خوایە ﷺ لە تەمەنی چوار ساڵی بۆ پێنج ساڵی ڕوویداوە ، بۆیە زانایان رەحمەتی خوای گەورەیان لێ بێت دەفەرموون: ئەم ڕووداوە چەند جارێک ڕوویداوە ،

یەکەم حاڵەتی شەق بوونی سینگی پێغەمبەر ﷺ لە تەمەنی چوار ساڵی بۆ پێنج ساڵیدا ڕوویداوە ، دەفەرموون: جارێکی تریش بە هەمان شێوە جبريل عليه السلام هاتۆتەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ سینگی شەق کردووە ، دەفەرموون: ئەمەیان لە کاتێ کە پێش ئەوەی بکرێت بە پێغەمبەر ، جارێکی تر جبريل عليه السلام هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ سینگی شەق کرد ، دڵی دەرهێنا و بە ئاوی زەمزەم شۆردييەوە ، بەڵام ئەم فەرموودەيە ، فەرموودەيەکی لاوازە ، وە ثابت بووە جارێکی تر پێغەمبەر ﷺ سنگی شەق کراوە کاتێک کە خوای گەورە بردی بۆ ئاسمان ، ئیسرا و میعراجی پێکرا ، ئەم فەرموودەيە، فەرموودەيەکی سەحیحە هەتا ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بتوانێت لەوێ موناجات لەگەڵ خوای گەورەدا بکات ، بە

ئاسمانەکاندا بڕوات هەتا دەگاتە لای خوای گەورە لەگەڵ خوای گەورەدا قسە بکات ، بۆیە چەند جارێ سینگی پێغەمبەری خوا ﷺ شەق کراوە هەتا ئەوەی کە بتوانێت ئەو ریسالەتە هەڵبگرێت و بتوانێ شتانێک ئەنجامبدات کە لە توانای ئینسانەکاندا نیە.

## ناوەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ

لە پاشاندا ئیمام رحمه الله دەفەرموویت: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند ناوێکی هەبوو:{ورَوَى جُبَيْرُ بنُ مُطْعِم قالَ: قالَ رسول الله ﷺ: إني محمَّدٌ، وأنا أحمدُ، وأنا الماحِي الذي يَمْحو اللهُ بي الكفرَ ، وأنا الحاشرُ الذي حَشَرَ الناس ، وأنا العاقِبُ الذي ليس بعدي نبي}: صحيح متفق عليه.

جبیری کوڕی مطعم رضي الله عنه بۆمان دەگێرێتەوە ، کە بخاری و مسلم هێناویانە لە سەحیحەکەیان دەفەرموویت: {کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەی فەرموو: من محمدم ، أحمدم ، ماحیم **(کە بە هۆی منەوە خوای گەورە کوفر دەسڕێتەوە و نایهێڵێت )** ، من حاشرم **(بۆ هۆی منەوە خەڵکی لە**

**ڕۆژی قیامەت حەشر دەکرێن** )،من عاقیبم **(چونکە لە دوای من هیچ پێغەمبەرێک نایەت** )}.

وە پاشان دەفەرموویت:{ ورَوَى أبو موسى عبدالله بنُ قيس، قال: سَمَّى لنا رسولُ الله ﷺ نفسه أسماء، منها ما حَفِظنا، فقالَ: أنا محمدٌ، وأنا أحمدُ، والمقفِّي، ونبيُّ التوبة، ونبيُّ الرحمةِ}

ئەبو موسی رضي الله عنه دەفەرموویت : پێغەمبەری خوا ﷺ چەند ناوێکی خۆی پێوتین ،هەمان بوو لە بەری کرد ، دەفەرموویت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من ناوم محمد ، ناوم أحمد ، ناوم مقفی **(واتە شوێن کەوتەی پێغەمبەرانی پێش خۆی** ) ، ناوم پێغەمبەری تۆبەیە ، ناوم پێغەمبەری ڕەحمەتە .

{وفي روايةٍ: ونبيُّ الملحَمة ، وهي المَقْتلةُ. صحيحٌ} رواه مسلم
وە لە ریوایەتی ناوم ملحەمەیە واتە : پێغەمبەری جیهادە.

{ورَوَى جابرُ بنُ عبد الله قالَ: قالَ رسولُ الله ﷺ : أنا أحمدُ، وأنا محمدٌ، وأنا الحاشرُ، وأنا الماحِي الذي يمحو الله بيَ الكفرَ، فإذا كانَ يومَ القيامةِ لواءُ الحَمْد معي، وكنتُ إمامَ المرسلينَ، وصاحبَ شفاعتهِمْ.}

لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت: من ناوم محمد ، أحمد ، حاشر ، ماحی ، وە فەرمووی: من لە ڕۆژی قیامەتدا هیوای حمدم پێیە ، من ئیمامی پێغەمبەرانم ، وە خاوەنی شەفاعەتم لە ڕۆژی قیامەتدا.

پاشان دەفەرموویت: ﴿وسماه الله ﷻ في كتابه العزيز﴾ خوای گەورە لە قورئاندا چەند ناوێکی لە پێغەمبەر ﷺ ناوە دەفەرموویت:

﴿بشيرًا ونذيرًا ﴿١١٩﴾﴾ [سورة البقرة] ، ﴿رَءُوفٌ ﴿١٢٨﴾﴾ [سورة التوبة] ، ﴿رحيمٌ ﴿١٢٨﴾﴾ [سورة التوبة] ،﴿رحمةً للعالمينَ ﴿١٠٧﴾﴾ [سورة الأنبياء].

ناوی بشیر بووە ، ناوی نذیر ،بووە ، ناوی رەئوف بووە ،ناوی رەحیم بووە ، ناوی رحمة للعالمین بووە.

**کەواتە لەم فەرموودانەدا بۆمان دەردەکەوێ پێغەمبەری خوا ﷺ چەند ناوێکی هەبووە.**

یەکەم ناو کە عبد المطلبی باپیری ناوی لێ نا ، کە ناوی نا محمد ، کە لە ناو عەرەبدا ناوێک نەبوو بەم ناوە ، پرسیاریان لێ کرد لە عبد المطلب وتیان: بۆچی دەتەوێ ناوی بنێی محمد فەرمووی: ئومێدم وایە کە سوپاسکراو بێ لە ئاسمانەکان و زەوی ، محمد بە مانا کوردیەکەی یانی سوپاس کراو ، ناوی نا محمد کە یەکەم ناو بوو لە ناو عەرەبدا کە تا ئەو کاتە کەس بەو ناوە ناو نەنرابوو ، وە دوای ئەوە خوای گەورە لە کتێبە ئاسمانەکانی پێش قورئاندا بە أحمد ناوی هێناوە ، یانی هەر پێغەمبەرێک کە هاتبێ خوای گەورە فەرموویەتی: پێغەمبەری ئاخر زەمان دێت ناوی أحمدە ، ناوێک لە ناوەکانی پێغەمبەر ﷺ أحمدە ، وە کۆمەڵێک ناوی هاتووە لە قورئاندا زانایان دەفەرموون:زۆرێک لە ناوانە سیفەتن نەوەک ناو بن.

## دەتوانین بڵێین ناوەکانی پێغەمبەر ﷺ چەند ناوێکن.

**یەکەم** ناو ئەوەیە کە باپیرەی ناوی نا.

**دووەم** ناو ئەو ناوانەن کە لە قورئاندا هاتوون.

**سێیەم** ناو ئەو ناوانەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی ناوی لە خۆی ناوە.

هەموو ئەم ناوانە زانایان باسیان کردووە ، هەتا هەندێک لە ئەهلی عیلم لەسەر ناوەکانی پێغەمبەر ﷺ کتێبیان نوسیوە ، هەندێکیان گەیاندویانەتە شەست ناو ، هەندێکیان وتیانە سەد ناوی هەیە ، زانایان فەرموویانە: زۆری ناوی شتێک بەڵگەیە لەسەر شەرەف و ڕێزی ئەو شتە ، بێگومان زۆری ناوەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵگەیە لەسەر شەرەف و ئەو پەری ڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ .



**وصلى الله وسلم على نبينا محمد واله وصحبه وسلم**

وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ